# داهێنراو

## البدعة

ئامادەکردن و وەرگێڕانی
باوکی عبدالله

ئەو نامیلکەیە وەرگیراوە لە کتابی (اقتضاء الصراط المستقیم...)
هی ابن تیمیة، وە کتابی (البدعة واثرها السيء في الامة)
هی سلیم الهلالي بە هەندێک زیادەوە لەلایەن ئامادەکەری ئەم باسە

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله، نحمده، ونستعينه، ونستغفره، ونعوذ بالله من شـــرور انفسنا، ومن سيئات اعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلـــل فلا هادي له، واشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، واشـــهد ان محمداً عبده ورسوله.

{ يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن الا وانتم مسلمون} [ال عمران:١٠٢]

{يا ايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلـــق منـــها زوجها وبث منهما رجالاً كثيرا ونساءً واتقوا الله الذي تساءلون بـــه والارحام ان الله كان عليكم رقيبا}[النساء:١].

{يا ايها الذين امنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم اعمـــالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فـــاز فـــوزا عظيمـــا} [الاحزاب: ٧٠- ٧١]

اما بعد: فان اصدق الحديـــث كتـــاب الله، واحســـن الـــهدي هـــدي محمد«ﷺ»، وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعـــة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

وبعد: زۆر له زانایانی ئیسلام ئاگاداریان کردووینەوە لەسەر بیدعە هەر لە سـەرەتای دەرچوونـی روونـــاکی ئیســـلامەوە، ئـــەوەش لەبـــەر ئـــەوەی پێغەمبەری ئازیز «ﷺ» موسـڵمانانی لێ ترسـاندووە بـە توونـدی لـە زۆر موناسەبەدا، جابری کوری عەبداللە «ﷺ» دەفەرموێ: (کان رســـول

الله «ﷺ» يخطب الناس فيحمد الله ويثني عليه بما هو اهله ثم يقول: من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وخير الحديث كتاب الله عز وجل وخير الهدي هدي محمد وشر الامور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار).
[اخرجه مسلم والنسائي وغيرهما، والجملة الاخيرة اخرجها النسائي باسناد صحيح].

بيدعه لەو زەمانەدا زۆر بلاْوبۆتەوە بە تايبەتی لای ئەوانەی کەم شارەزان لە ئيسلام، وە يەك لە هۆيەکانی بلاْوبونەوەی بيدعە (داهينراو) ئەوەيە کە زۆر لە خەلْکی پێشەوای نەزان و نەفام (جاهل) بۆ خۆيان دادەنێن فتوايان بۆ دەدەن و فێريان دەکەن و بەبێ زانياری قسە لە دينی خوا دەکەن، دەربارەی وانە پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ: (ان الله لا يقبض العلم انتزاعا ينترعه من العباد ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى اذا لم يبق عالما اتخذ الناس رؤوسا جهالا فسئلوا فافتوا بغير علم فضلوا وأضلوا)
[حديث متفق عليه ولفظه للبخاري] وە هەروەها دەفەرموێ: (ان من اشراط الساعة ان يلتمس العلم عند الأصاغر) [سلسلة ألاحاديث الصحيحة ٦٩٥]
قال ابن المبارك رحمه الله الأصاغر: أهل البدع (كتاب الزهد عبدالله ابن المبارك)، بەلام ئەوە مانای ئەوە نىيە کە کەس نەبێ لەسەر هەق مابێ پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ (لا تزال طائفة من امتي يقاتلون على

حق ظاهرين على من ناوأهم، حتى يقاتل اخرهم المسيح الدجـــال).
[سلسلة الاحاديث الصحيحة ١٩٥٩]

بۆ ئەوەی خۆمـان بپـارێزین لـە بیدعـە دەبـێ ئـەو ڕێگایانـە بگرین کـە صەحابـەکانی پێغەمبـەر «ﷺ» گرتوویانـە یەکـەم جـار بزانــین کامــە سوننەتی ڕاستە شوێنی بکەوین و دووەم بیدعە بناسین بۆ ئەوەی خۆمانی لێبپارێزین لەبەر ئەوە حوذیفەی کوڕی یەمان( ﷺ) دەفەرموێ : (كــان الناس يسألون رسول الله «ﷺ» من الخير، وكنت أسال عن الشـــر مخافة ان يدركني). [اخرجه الشيخان وغيرهما].

شاعیریش دەفەرموێ: عرفت الشر لا للشر لكن للتوقيه، ومن لم يعرف الخير من الشر يقع فيه

لەبەر ئەوە هەڵدەستین ان شاء الله بە ڕوون کردنەوەی مانای بیدعــە، وە چۆنیش دەیناسین؟ وە ڕێگاکانی خۆپاراســتن لێی چییــە؟ وبالله وحـــده نستعين

## «ما هي البدعة»؟

### داهێنراو چییە؟

پێناسـەی بیدعە لە زمانــەوانیدا: نـاوی شـتێکە کـە دامـەزرێ‌و داهێنرێ لەسـەر نموونەی پێشتر نەبێ. پێناســەی بیدعـە لـە شـەرعدا: ئـەو ڕێگـە داهێنراوەیە لە شەرعدا بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خوا وە بەڵگەیەکی

راستى شەرعيشى لەســـەر نـەبێت. وە بزانـە بـراى موسـڵمان يـەكێك لـە بنچينەى دين كە پێويستە لەسەرمان بڕوامان پـێ‌ى هـەبێت ئەوەيـە كـە خواى گەورە ئەو دينەى بۆمان تـەواو كـردووە هيچ شـتێك نىيـە باسـى نەكردبێ، ئەوەندەى لەسەر خەڵك داناوە كە بەس جێ‌بەجێ‌ى بكـەن و گوێ رايەڵى بكەن و بەس، ئەوەش بەڵگەى زۆرى لەسەرە، خواى گەورە دەفەرموێ: (اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيـــت لكم الاسلام دينا) [المائدة: ٣].

هەروەها دەفەرموێ: (وأن هذا صراطي مستقيما فـــاتبعوه ولا تتبعـــوا السبل فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون) [الانعـــام: ١٥٣].

وە دەفەرموێ: (وما آتاكم الرسول فخذوه وما نـــهاكم عنـــه فانتـــهوا) [الحشر: ٧]. وە ئايەتى زۆرتر هەن هەر لەو مانايە.

پێغەمبەرى ئازيزمان «ﷺ» هەواڵى پێداوين كـە پـەيامى ئيسـلام تـەواو بووەو هيچ مەجالى بيدعەو شت زيادكردن نىيە لە ئيسلامدا، هـەر وەكـو پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ: (ما تركت شيئا يقربكم إلـــى الله "تبـــارك وتعالى" الا وأمرتكم به وما تركت شيئا يبعدكم عن الله تعالى ويقربكم الى النار الا ونهيتكم عنه). [حديث صحيح اخراجه الامام شافعي في الرسالة].

وه دهفهرموێ «ﷺ»: (ما تركت شيئا مما امركم الله به الا وقد امرتكم به، ولا شيئا مما نهاكم عنه الا ونهيتكم عنه) [حديث صحيح بمجموع طرقة].

وه دهفهرموێ «ﷺ»: (اني قد تركتكم على مثل البيضاء، ليلها كنهارها، لا يزيغ عنها بعدي الا هالك) [اخرجه احمد وغيره وصححه الالباني في تخريج كتاب السنة].

جا ئاگادار به برای بهڕێزم ئهچیه ریز ئهوانهی كه به هیلاك دهچن خوای گهوره ههموو لایهكمان بپارێزێ لهو بهلایه.

## البدعة في الدين امر غير مشروع

بیدعه له دیندا شتێكی مهشروع نییه واته: (لهلایهن خواو پێغهمبهر «ﷺ» دانهمهزراوه).

وه بهلگهش لهسهر ئهوهی كه بیدعه له دیندا شتێكی مهشروع نییه له لایهن خواو پێغهمبهرهوه «ﷺ»

١-یاسادانان (تشريع) مافی خوای پهروهردگاره، هیچ مافی ئینسانی پێوه نییه، وه ئهگهر دروست بوایه زیاد كردن له ئیسلام ئهوا كهم كردنیش دروست دهبوو. لهبهر ئهوه پێغهمبهر «ﷺ» نههی كردووه له زیاد كردن له دین وهك دهفهرموێ: {اذا حدثتكم حديثا فلا تزيدن علي} [سلسلة الاحاديث الصحيحة ٣٤٦].

٢. ئەو کەسەی بیدعە لە دیندا زیاد دەکا ڕەخنە لە خوای گەورە دەگریّ «والعیاذ بالله» چونکە خوای گەورە شەرعی تەواو کردووە و لەسەر خەڵکی پێویست کردووە کە پەیوەست بن پیّ‌ی و لانەدەن لیّی، ئەو کەسەی بیدعەیەك دادەهێنیّ ئەوەی لیّ دەفامرێتەوە کە بڕوای بەوە نەبێت خوای گەورە ئیسلامی تەواو کردووە. وە ئیمام مالك دەفەرمویّ "رحمه الله": (من ابتدع في الاسلام بدعة يراها حسنة فقد زعم ان محمداً خان الرسالة، لأن الله يقول: (اليوم اكملت لكم دينكم واتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الاسلام دينا) فما لم يكن يومئذٍ دينا فلا يكون اليوم دينا). وە ئینسانی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە سوننەتی پێغەمبەر «ﷺ» زیندوو بکاتەوە و بانگەواز بۆ لای خوا بکات و واز لەو بیدعانە بهێنێت کە خەڵك خۆیان پێوە گرتووە ئەگەر واش بزانن لەسەر سوننەتن و لەسەر بیدعەی چاکن وە گوێش نەداتە ئەو بوختانانەی کە بۆی دەکرێت لەلایەن خەڵکەوە بەوەی کە دەڵێن دینێکی نوێیان هێناوە توندن و یان وەهابین و شتی تریش. مادەم لەسەر قورئان و سوننەتی پێغەمبەر بیّ «ﷺ» خوای گەورە دەفەرمویّ: (وما أكثر الناس ولو حرصت بمؤمنين).

٣. پێغەمبەریش «ﷺ» بیدعەی ڕەت کردۆتەوە بەبیّ جیاوازی چاك و

خراپ وەك دەفەرموێ «ﷺ»: {من احدث في امرنا هذا ما ليس منـــه فهو رد}[متفق عليه]. وە دەفەرموێ: {من عمل عملا ليس عليه امرنـــا فهو رد}[رواه مسلم]. ودەفەرموێ: (لكل عمل شرة ولكل شرة فـــترة، فمن كانت فترته الى سنتي فقد اهتدى ومن كانت فترته الى غير ذلـك هلك) «صحيح الترغيب». فە هەموو كردەوەيەك كە بيكەين مەبەستمان پێی نزيك بوونـەوە بێ لـە خـوا دەبێ بـەگوێرەی قورئـان و سـوننەتی پێغەمبەر «ﷺ» بێ، ئەما ئەو بيدعەچی‌يانەی کـە دەڵێن چـی تێدايـە ئەگـەر ئـەو بيدعانـە بكـەين مـادام زكـری خـوای تێدايـە ئەگـەر خـــواو پێغەمبەريش «ﷺ» فەرمانيان پێ نەدابێ، ئەمـە شـتێكی راسـت نی‌يـە چونكە خوای گـەورە دينـی بومـە تـەواو كـردووە بـۆ ئـەوەی بـەگوێرەی دينەكەی بيپەرستين نەك بـەگويرەی هـەواو هەوەســی خومـان و نـەريتی خەلك و بيدعە.

## كيف تعرف البدعة؟

### چۆن بيدعە دەناسی؟

شێخی ئيسلام ابن تيميه «رحمـــه الله» رێگايـەكی جوانـی دانـاوە بـو ناسينی بيدعە لە كتابی (العبودية) كە دەفەرموێ:

وجماع الدين اصلان:
١. ان لا نعبد الا الله.
٢. ولا نعبده الا بما شرع ، لا نعبده بالبدع.

وه له كتابى (اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة اصحاب الجحيم)يشدا دهفهرموئ: (فالاصل في العبادات ان لا يشرع منها الا ما شرعه الله، والاصل في العادات: ان لا يحضر منها الا ما حضره الله).

واته: كۆى هەموو دین دوو بنچینەیە، تەنها خوا بپەرستین. وە نەیپەرستین ئیلا بەوەی کە دایناوە، نەیپەرستین بە بیدعە. وە ئەصڵیش لە خوا پەرستیدا ئەوەیە هیچ خوا پەرستیەك نەکەین تەنها ئەوەی خوا دایناوەو ڕێی پێداوە، وە ئەصلیش لە عادات هیچی حەرام نییە ئیلا ئەوەی خوا حەرامی کردووەو نەهی لێ کردووە). لەبەر ئەوە تاوەکو کردەوە ببێتە چاك و پێی لە خوا نزیك ببینەوەو خواوە ڕێ بگرێ دەبێ دوو مەرجی تێدا بێتە دی:-

یەکەمیان: دەبێ خاوەنەکەی مەبەستی بێ تەنها خوای گەورە بێ. (الاخلاص).

دووەمیان: دەبێ ئەو کردەوەیە بەو شێوەیە بێ کە خوا دایناوە لە قورئانی پیرۆز یان پێغەمبەر «ﷺ» ڕوونی کردۆتەوە لە سوننەتەکانیدا.

ئەگەر کردەوەیەك ئەو دوو مەرجانەی تیّدا نەبیّت ئەوە لەلای خوای گەورە بە چاك ناژمیّردریّو وەرناگیریّ. ئەمما ئەوانەی دەڵیّن بەسە کە نییەتمان بۆ خوایە خوای گەورە وەری دەگریّ، ئەوە راست نییە، چونکە نیەت بەس نییە بۆ ڕاستی کردەوە دەبیّ لەگەڵ نیەتیش ئەوەی لەگەڵ بیّ کە کردەوەکە بەو شیّوەیە بیّ کە خواو پیّغەمبەر «ﷺ» ریّگایان پیّداوەو نیەتی پاك شتی خراپ ناکا بە چاك و راست.

## طوبى للغرباء

طوبى داریّکە لە بەهەشت، وە ئەگەر ئەو دوو مەرجانەی باسمان کرد لەسەر کردەوەی خەلکی تطبیقی بکەین لەو سەردەمەدا دەبینین کەم کردووە هەیە ئەو دوو مەرجەی تیدا بیّتە جیّ کە ئەمە وا لە فرمانەکانی ئیسلام دەکا لە ناو خەڵکی بەشتیّکی غەریب دیّتە بەرچاو ئەو کەسانەی کە لەسەر سوننەتی پیغەمبەر «ﷺ» دەمیّننەوە تووشی ئازارو ئەشکەنجەکی زۆر دەبن پیّغەمبەریش «ﷺ» هەواڵی داینیّ بە روودانی ئەمە دەفەرمویّ: (بدأ الاسلام غريبا وسيعود غريبا، كما بدأ، فطوبى للغرباء) فقيل من الغرباء؟ فقال: (الذين يحيون ما افسد الناس من سنتي) [روى للجزء الاول منه مسلم والترمذي بلفظ قريب منه وقال:

وقال: حديث حسن صحيح]. وه دەفەرموێ «ﷺ»: [ان من ورائكم ايام صبر، للمتمسك فيهن بما انتم عليه اجر خمسين منكم]
قالوا: يا نبي اللة او منهم؟ قال: بل منكم) [ اخرجه ابن نصر في السنة وصححه الإلباني بشواهده].
داوا له خوا دەكەين بۆ خۆمان و بۆ موسلمانان كه لەو كەسانەمان بگێڕێ كه ئەو سوننەتانە زیندو دەكەنەوە خەڵك مرانديتيان لە سوننەتەكاني پێغەمبەر «ﷺ» وە لەو كەسانەمان بگێڕێ كه دەست بەوە دەگرن كه پێغەمبەرو «ﷺ» صەحابەكاني (رضي الله عنهم) لەسەری بوون انه سميع مجيب.

## موقف الصحابة «رضي الله عنهم» من البدع

هەڵوێستی صەحابەكان «رضي الله عنهم» بەرامبەر بيدعە :-

عبداللەی كوڕی مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێ: (اتبعوا ولا تبتدعوا فقد كفيتم) [اخرجه الدارمي باسناد صحيح].
وە عبداللەی كوڕی عمر (رضي الله عنه) دەفەرموێ: (كل بدعة ضلالة، وان رأها الناس حسنة) [اخرجه الدارمي باسناد صحيح].
وە ئەگەر تەماشای كردەوەكانيان بكەين دەبينين وەكو قسەكانيان وايە

وەك دەفەرمون: (كنا نجلس على باب عبدالله ابن مسعود قبل صلاة الغداة، فاذا خرج مشينا معه الى المسجد، فجائنا ابو موسى الاشعري، فقال: اخرج اليكم ابو عبدالرحمن بعد؟ قلنا: لا فجلس معنا حتى خرج، فلما خرج قمنا اليه جميعا، فقال له ابو موسى: يا ابا عبدالرحمن اني رأيت في المسجد أنفا امرا انكرته، ولم ار والحمد لله الا خيرا، قال : فما هو؟ قال ان عشت فستراه، قال: رأيت في المسجد قوما حلقا جلوسا ينتظرون الصلاة في كل حلقة رجل وفي أيديهم حصا فيقول : كبروا مائة، فيكبرون مائة فيقول سبحوا مائة : فيسبحون مائة، قال : فماذا قلت لهم؟ قال: ما قلت لهم شيئا انتظار رأيك أو انتظار امرك، قال: افلا أمرتهم ان يعدوا سيئاتهم، وضمنت لهم ان لا يضيع من حسناتهم، ثم مضى ومضينا معه، حتى أتى حلقة من تلك الحلق فوقف عليهم، فقال : ما هذا الذي أراكم تصنعون! قالوا: يا أبا عبدالرحمن حصا نعدبه التكبير والتهليل والتسبيح، قال : فعدوا سيئاتكم فأنا ضامن ان لا يضيع من حسناتكم شيء، ويحكم يا أمة محمد ما أسرع هلكتكم، هؤلاء صحابة نبيكم «ﷺ» متوافرون، وهذه ثيابه لم تبل، وانيته لم تكسر، والذي نفسي بيده انكم لعلى ملة أهدى من ملة محمد أو ومفتتحوا باب ضلالة، قالوا: والله يا أبا عبدالرحمن ما أردنا الا الخير، قال وكم من مريد للخير لن يصيبه، ان رسول الله «ﷺ» حدثنا: (أن قوما يقرءون القرآن لايجاوز تراقيهم) وايم الله ما أدري لعل أكثرهم منكم، ثم تولى عنهم، فقال عمرو بن سلمة: رأينا عامة أولئك الحلق يطاعنونا يوم النهروان مع الخوارج. (اخرجه الدرامي وابو نعيم باسناد صحيح).

سەرنجی خوینەران رادەكیشین تەنها بۆ ئەم رستەیە (والذي نفسي بيده

انكم لعلى ملة اهدى من ملة محمد او مفتتحوا باب ضلالة، قـــالوا: والله يا ابا عبدالرحمن ما اردنا الا الخير، قال: وكم من مريد للخــير لن يصيبه). لەپاش ئەوەی (ابو موسی الاشعري) «رضي الله عنه» خەبەری دا بە عبداللەی کوڕی مسعود «رضي الله عنه» کە کۆمەڵێك پەیدا بوونە ئەو بیدعەیە لەناو مزگەوتا دەکەن بە بازنە دادەنیشن و بەردی ووردیان پێیە زکری پێ دەکەن، کە عبداللەی کوڕی مسعود هاتە لایـان و دیتـی وای پێ فەرموون کە ئەوە دەبێ بە هەموو بیدعەچی‌یەك بگوترێ کـە مانـای: (سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە ئێوە یان لەسەر دینێکن کە لـە دینی محمد «ﷺ» راسـت تـرە یـان ئیـوە دەرگـای گومڕایـی دەکەنـەوە ئەوانیش ووتیان: (ئەمە مەبەستمان تەنها خێر بووە) ئـەویش فـەرمووی: (چەند کەس مەبەستی خێر بـووە، بـەلام پـێی نەگەیشتی‌یە، چونکـە خێر هەر لە دینی خوایە) لێرەدا بە راشکاوی ئـەوەی لێدەفامرێتـەوە کـە هەر کەسێك بیدعەیەك بکات دیارە پێی وایە کە ئیسـلام تـەواو نـەبووە دەڵێم ئەو ئەثەرە پیرۆزە بەسە بۆ پوچەڵ کردنەوەی هـەموو شـوبهەکانی بیدعەچی‌یەکان والحمد لله.

# اسباب الابتداع

هۆیەکانی دروست بوونی بیدعە :-

١. شارەزا نەبوون لە سوننەت و علمی (مصطلح الحدیث)، بە شێوەیەك هەندێك خەڵك حەدیثی ضعیف و صحیح لێك ناکەنەوەو کار بە حەدیثی موضوع و ضعیف دەکەن.

٢. هەندێك کەس کەسانێکی نەفام دەکەنە پێشەوای خۆیان کە بە نەزانی فێریان دەکەن و فتوایان بۆ دەدەن بە هەواو هەوەسی خۆیان بەبێ زانیاری لە دینی خوا شوێن ئارەزووی پێشەواکانیان دەکەون.

پێغەمبەریش «ﷺ» دەفەرموێ: {وانه سیخرج في امتي اقوام تتجاری بهم الاهواء، کما تتجاری الکلب بصاحبه، ولا یبقی منه عرق ولا مفصل الا دخله}. [صحیح الترغیب ٤٩]. ئەی برای بەڕێزم بە دوای ئارەزووی خۆت و بیدعەچی‌یەکان مەکەوە بەدوای فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی «ﷺ» کەوە فتوای کەس وەرمەگرە بەبێ بەڵگە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر «ﷺ».

٣. هەندێك نەریت و خورافات هەر لە کۆنەوە ماینەوە کە هیچ بەڵگەشی لەسەر نی‌یە لە قورئان و سوننەت وەکو تازیە بەو شێوەی

ئیستا وه ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی مەولودو غەیری وانەش لە بیدعەو خوڕافات.

٤. شوێن کەوتنی کویرانەو باوەڕی مەعصومی لـە هـەندێك شـێخەکانی طەریقەت کە هەرچی پێیان بڵێن بە دینی دەزانن.

● امثلة على بعض البدع المنتشرة في هذا الزمان

چەند نموونەیەك لەو بیدعانەی بلاون لەو سـەردەمەدا

● ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی لە دایك بوونی پیغەمبەر «ﷺ» بـەس ئاهەنگ گێڕانەکـە بیدعەیـە چ جـای ئـەو هـەموو گوناهـەی تیـایدا دەکرێت لە سروود و گۆرانیو هاوار کردن لە غەیری خـواو شـتیتر خوا بمان پارێزێ.

● ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی (الاسراء والمعراج) ئەوەش بیدعەیەو هیچ ئەصڵێکی نییە لە قورئان و سوننەت و کردەوەی صەحابـەکان ئەوجا بەهەر ناوێکەوە بکرێ ئەگەر بـە نـاوی دەعـوەش بکـرێ لـە لایەن هەندێکەوە خوای گەورە وەری نـاگرێو رێگـای تـر زۆرە بۆ بانگ کردنی خەڵك بۆ لای ئیسلام.

● صـەڵاوەت خوێنـدن بـە دەنگـی بـەرز لـە پـاش بـانگ ئەمـەش بیدعەیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسـەر نییە بەڵام دەتوانی بە دەنگی نزم

بۆ خۆی بلّێ هەروەك لە فەرمودەی پیغەمبەر «ﷺ» هاتووە.

- وە چوونە سەر گۆڕی پیاو چاکان و هاوار کردن لێ یانوحەیوان سەر برین لەسەر گۆڕیان و بڕوا بوون بەوەی کە ئەمانە دەتوانن یارمەتیت بدەن و شیفات بۆ بنێرن کە ئەمە شیرکی گەورەیەو خوای گەورە پێغەمبەری «ﷺ» رەوان کردووە بۆ نەهێشتنی. وەبیدعەی تریش زۆرن بەلام دەتوانین بیناسین بەو مەرجانەی پیشوو کە باسمان کرد.

## زیانەکانی بیدعە

١. کاری خاوەن بیدعە وەرناگیرێ خوای گەورە دەفەرموی: {قل هل ننبئكم بالأخسرين اعمالا الذين ضل سعيهم في الحياةالدنيا وهم يحسبون انهم يحسنون صنعا} [الكهف:١٠٣] وە پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموی: {من احدث في امرنا ما هذا ليس منه فهورد} [متفق عليه].

٢. تۆبەی لێ وەرناگیرێ هەتا واز لە بیدعەکەی نەهێنێ پێغەمبەر «ﷺ» دەفەرموێ {ان الله حجب التوبة عن كل صاحب البدعة حتى يدع بدعته} [حديث صحيح اخرجه الطبراني والترمذي وحسنه].

٣. خاوەن هەموو بیدعەیەك مەلعوونە لەبەر فەرمودەی پێغەمبەر «ﷺ»: {من احدث فیها أو آوى محدثا فعلیه لعنة الله والملائكة والناس اجمعین} [اخرجه البخاري ومسلم وغیرهما، والحدیث عام انظر فتح الباري (١٢/٢٨٧)].

٤. بیدعەچی تاوانی ئەوانەشی دێتە سەر کە چاوی لێ دەکەن لەو بیدعەیەی کە دەیکا یان فێریان دەکا خوای گەورە دەفەرموێ: {لیحملوا اوزارهم كاملة یوم القیامة ومن اوزار الذین یضلونهم بغیر علم} [النحل: ٢٥].

زوو کە ئەی برای شیرینم بە خۆت داوەرەوەو بەسەر هەموو عیبادەتەکاندا بڕۆوە بزانە ئەگەر هەر بیدعەیەکی تێدایە یەکسەر وازی لێ بهێنەو تەوبە بکەو مەگەڕێوە سەری وە بەوەش هەڵمەخەڵەتێ کە فلاٚن مامۆستاو فلاٚن ئەمیرو فلان شێخ دەیکەن لە قسەی خەڵکیش مەترسێ هەر ناوێکت لێ بنێن و هەر بوختانێکت بۆ هەڵبەستن ئەوە بزانە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)و پیاو چاکان تەنانەت خواو مەلائیکەتەکانیشی لە زمانی خەڵك سەلامەت دەرنەچووینە.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب الیك.

# البدعة

بسم الله الرحمن الرحيم

وما أرسلناك الا رحمة للعالمين



چاپی یەکەم ١٤١٨ ک - ١٩٩٨ز هەولێر